# وانەی یەکەم :

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدلله وحده ، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده ، أما بعد :

التوحيد بە تەنها اللە پەرستی فەزڵ و پاداشت و پلە و پایەی زۆر گەورەی هەیە ، وە شوێنەوار و کاریگەریەکی هەیە کە جێگای شانازیە ، وە دەرئەنجامی زۆر جوانی هەیە ، وە لەوانیش ئەمانەنە کە هەندێکی باس دەکەین بإذن الله :

خێر و چاکەی دونیا و قیامەت لە دەرئەنجامەکانی پلە و پایە و پاداشت و بەروو بوومەکانی تەوحیدەوەیە.

تەوحید گەورەترین هۆکارە بۆ دەروو لێ بوونەوە و ڕزگار بوون لە هەموو ناخۆشی و نەهامەتی و دەردەسەریەکانی دونیا و قیامەت ، اللە تعالى بەهۆی ئەوەوە عقوبە و سزا لادەبات لە هەردوو دونیا ، وە هەر بەهۆی ئەوەوە هەموو نازو نیعمەت و خێر و چاکەکان فراوان دەکات.

1) بە تەنها اللە پەرستی بە پاک و بێگەردی دەبێتە بەروو بووم و بەرهەمی نەبوونی ترس لە سزای اللە و ئەمن و هێمنی

تەواوی دەبێت بۆ ئەو کەسە لە دونیا و قیامەتدا ، **اللە عز وجل** دەفەرمویت: ( **الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ** ) سورەتی الأنعام82

**واتە :** ئەوانەی کەوا ئیمان و باوەڕیان هێناوە وە ستەم و هاوەڵگەریان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردووە ، ئاسوودەیی و هێمنی هەر بۆ ئەوانەیە ، هەر ئەوانەشن کەوا ڕێنمایی کراون .

* وە بۆ خاوەنەکەی ڕێگای ڕاست و هیدایەتی تەواو بە دەست دەهێنێت ، وە هەروەها تەوفیق بوونە بۆ هەموو پاداشت و دەستکەوتێک.

2) اللە سبحانە وتعالی بەهۆی **تەوحید**ەوە لە گوناهە گەورەکان خۆش دەبێت وە هەر بەهۆی ئەوەوە گوناهە بچووکەکانیش دادەپۆشێت ، چونکە لە **فەرمودەی قودسی** دا هاتووە : **عَن أَنَس بن مالِك** رَضِيَ الله عَنه ، قَال : سمِعتُ **رسولَ اللهِ** صلَّى اللهُ عليه وسلَّم يقولُ : قَال **الله تَبارَكَ وَتَعالَى** ... : يا ابنَ آدَمَ ، إنَّك لو أَتيْتَني بقُرابِ الأرضِ خَطايا ثمَّ لَقيتَني لا تُشرِكُ بي شَيئًا ، لَأَتَيْتُك بقُرابِها مَغفِرةً . الترمذي ، كتاب الدعوات ، باب فضل التوبة والاستغفار ، 5/548 ، برقم[ 3540

واتە : لە ئەنەسـی کـوڕی مالـک ـەوە اللـه لێـی ڕازی بـێ فەرموویەتی : گـوێم لە رسـول اللـه بــوو صـلى اللـه عليـه وسـلم کە دەیفەرمــوو : اللـه تَبـارَكَ وَتَعـالَى دەفەرموێـت : ئەی نەوەی ئـادەم ، ئەگەر تـۆ بە ئەنـدازەی زەوی هەڵە و تاوانـت هەبێـت لەپاشـان بگەیـت بە لیقـای مـن هـیچ شـتێکت نەکـردبێتە هـاوبەش و شـەریک بـۆم ، ئەوا منـیش بە ئەنـدازەی زەوی لێخۆشـبوونی خۆم دەڕژێنم بـە سەرتا.

3) اللـه تعـالى بەهـۆی ئەم تەوحیـدەوە دەتخـاتە بەهەشـتەوە هەروەک لەم فەرمـوودە شـیرینەدا هـاتووە : عـن عبـادة رضي اللـه عنـه (قـال : قـال رسـول اللـه ) صـلّى اللـه عليـه وسـلّم ) : ( مَـن شَـهِدَ أَنْ لا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ وَحْـدَهُ لا شَرِيـكَ لَـه ، وَأَنَّ مُحَمَّـدًا عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ ، وَأَنَّ عِيسَىـ عبـدُ اللَّـهِ وَرَسُـولُهُ ، وَكَلِمَتُـهُ أَلْقَاهَـا إلى مَـرْيَمَ وَرُوحٌ منـه ، وَالجَنَّـةُ حَـقٌّ ، وَالنَّـارُ حَـقٌّ ، أَدْخَلَـهُ اللَّـهُ الجَنَّـةَ عـلَى مـا كـانَ مِـنَ العَمَلِ ) (متفق عليه )

واتە : لە عبـادەی کـوڕی صـامت اللـه لێـی ڕازی بێـت فەرمـوویەتی رسـول اللـه صـلى اللـه عليـه وسـلم فەرمـوویەتی : هەرکەسـێک

شـاهێدی بـدات کە هـیچ پەرسـتراوێکی بە هەق نیـیە جـگە لە اللـە نەبێـت ، وە محمـدیش بەنـدە و نێـردراوی اللـە ـــیە ، وە عیسـای کـوڕی مەریەم ـــیش بەنـدە و نێـردراوی اللـە ـــیە ، وە کەلـیمەی اللـە ـــیە واتە : بە وشـەی کـن درووسـت کـراوە ، وە روحـێکە لەلای اللـە ـــوە ، وە شـاهێدیش بـدات کە بەهەشـت حەقە ، وە جەهەنەمـیش حەقە ، ئەوا اللـە تعـالی ئەو کەسـە دەخاتە بەهەشتەوە با کردەوەی هەرچی بێت.

وفي حـديث جـابر بـن عبـد اللـه رضي اللـه عـنهما ( عـن النبـي ) صلّى الله عليه وسـلّم ( أنـه قـال ) : مَـن مـاتَ لا يُشْرِكُ باللَّـهِ شـيئًا دَخَلَ الجَنَّةَ. صحيح مسلم 93

واتە : وە لە فەرمـوودەی جـابری کـوڕی عبداللـە هـاتووە اللـە لەخـۆی و بـاوکی ڕازی بێـت ( لە پێغەمـبەرەوە ) صلى اللـه عليـه وسلم کەوا فەرمـوویەتی : هەرکەسـێک مـرد و هـیچ شـتێکی نەکـردبێتە شـەریک و هـاوبەش بـۆ اللـە ، ئەوا دەچێـتە بەهەشتەوە.

4) تەوحیـد ڕێگـری لە چوونی بەنـدە دەکـات بـۆ جەهەنەم بە هەتا هەتایی ئەگەر لە دڵیدا تەواو و کامل بوو:

ففي حديث عتبان رضي الله عنه ( عن النبي ) صلّى الله عليه وسلّم

(فإنَّ اللَّهَ قدْ حَرَّمَ علَى النَّارِ مَن قالَ : لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ ، يَبْتَغِي بذلكَ وجْهَ اللَّهِ ) متفق عليه

واتە : لە فەرموودەی عتبان هاتووە الله لێی ڕازی بێت لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم کەوا فەرموویەتی : بەڕاستی الله قەدەغەی کردووە لەسەر ئاگر کەسێک بسوتێنێت کە بە مەبەستی گەیشتن بە ڕوخساری ، الله گوتوویەتی لا إلە إلا الله .

* ڕێگری هەمیشەیی مانەوە دەکات لەناو ئاگردا ئەگەر لە دڵی ئەو کەسەدا بە ئەندازەی دەنکە خەردەلەیەک ئیمانی لە دڵیدا هەبێت.

# وانەی دووەم :

5) ڕێگری هەمیشەیی مانەوە دەکات لەناو ئاگردا ئەگەر لە دڵی ئەو کەسەدا بە ئەندازەی دەنکە خەردەلەیەک ئیمانی لە دڵیدا هەبێت.

6) تەوحید گەورەترین سەبەب و هۆکارە بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی اللە تعالی و ئەجر و پاداشتەکەی ، وە خۆشحاڵترینی خەڵکیە لە شەفاعەت کردنی محمد صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوکەسە :

عن أبي هريْرَةَ رضي الله عنه قال : قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللهِ ، مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ؟ قالَ رسولُ اللهِ صلّى الله عليه وسلّم ( لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لَا يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ ؛ لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ ": لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ " خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ ، أَوْ نَفْسِهِ ) صحيح البخاري الصفحة أو الرقم 99

واتە : لە أبو هريرةوە اللە لێی ڕازی بێت فەرموویەتی : گوتم : ئەی رسول اللە ، کێ خۆشحاڵترین کەسە بە شەفاعەتی تۆ لە

ڕۆژی قیامەتـدا ؟ پێغەمـبەریش صـلی اللـه علیـه وسـلم فەرمـووی: گومـانم وابـوو ئەی ابـو هریـرة کەس پـێش تـۆ ئەو پرسـیارەم لێنەکـات ، چـونکە دەبیـنم تـۆ زۆر پەرۆشـیت بـۆ فەرمـوودە ، خۆشـحاڵترین کەس بە شـەفاعەتی مـن لە ڕۆژی قیامەتـدا ئەو کەسـەیە کە لە نـاخی دڵـیەوە یـان دەروونـیەوە وتبێتـی لا إلـه إلا الله .

7) گشـت کردەوەکـان و ووتەکـان لە ڕووکەش و نـاخ و دەروونـدا لە قبـوڵ بوونیـان و کامـڵ و تەواو بوونیـان و لە وەرگرتنـی پاداشـت لەسـەریان هەمـوو ئەمـانە وەسـتاون لەسـەر تەوحیـد ، جا هەرکاتێـک تەوحیـد و إخـلاص و دڵسـۆزیەکەی بـۆ اللـه بەهێـز بـوو ئەوا تەواوی ئەم کـارو بـارانەش کامـل دەبـن و تەواوتر دەبن.

8) لەسـەر بەنـدە ئاسـان دەبێـت ئەنجـام دانـی کـردەوە چاکەکـان ، وە وازهێنـان لە خراپەکـان ، وە لەو بەڵا و موسـیبەتانەی کە تووشـی دەبـن ئاسـوودە دەبێـت و لەبیریـان دەکـات ، جـا مرۆڤـی موەحیـدی دڵسـۆز بـۆ اللـه تعـالی لە تەوحیدەکەیـدا عیبـادەت و

گوێڕایەڵیەکانی لەسەر سووک دەبێت ، لەبەرئەوەی هیوا و ئومێدی هەیە لە پاداشت و ڕەزامەندی پەروەردگاری.

**9)** وە لەسەری ئاسان دەبێت وازهێنان لەو شتانەی کە نەفس و هەواو ئارەزووی داوای لێ دەکات لە تاوان و سەرپێچی ، لەبەرئەوەی ترسی هەیە لە تورە بوون و سزا و ئەشکەنجەی الله تعالی.

**10)** ئەگەر تەوحید لە دڵی بەندەدا تەواو و کامل بوو ئەوا الله تعالی ئیمان و باوەڕ لەلای ئەو بەندەیەی خۆشەویست دەکات وە لە دڵیدا ڕازاوە و جوانی دەکات ، وە ڕقی دەکاتەوە لە کوفر و فیسق و تاوان و سەرپێچی ، وە دەیکات بە یەکێک لە ڕێنمایی کارەکان.

**11)** تەوحید نارەحەتی و ناخۆشیەکان لەسەر بەندە سووک دەکات ، وە ئێش و ژانەکانیشی لەسەر ئاسان دەکات ، جا بەگوێرەی کەمالی و تەواویەتی تەوحید لە دڵی بەندەدا پێشوازی لە نارەحەتی و ناخۆشیەکان و ئێش و ئازارەکان

دەکـات بە دڵێکـی فـراوان و نەفسـێکی ئـارام ، وە تەسـلیم و ملـکەچ دەبێـت و ڕازی دەبێـت بە هەمـوو قەدەرە بە ئازارەکـانی اللـە تعـالی ، وە ئەمەش لە گەورەتریـنی هۆکارەکـانی فـراوان بوونی دڵە.

**12)** بەنـدە ئـازاد دەکـات لە کـۆیلایەتی کـردن و بەنـدایەتی کردنـی مەخلـوق و دروسـتکراوەکان و خـۆ پەیوەسـت کـردن پێیـانەوە ، وە ئازادیـان دەکـات لە ترسـان لێیـان و هیـوا و ئومێـد بـوون بەوان ، وە کـارکردن لەپێناویـان ، وە ئـا ئەمەشـە عیـززەت و شـکۆی حەقیقـی و ڕاسـتەقینە ، وە شـەڕەف و پـایە بەرزی ، وە لەگەڵ ئەمەشدا دەبێـتە عەبـد و بەنـدە بـۆ اللـە تعـالی ، هیـوا و ئومێـدی نیـیە بە بـێجگە لەو ، وە لەو نەبـێ لە کەسـیتر ناترسـێ ، وە هەر بەمەش ڕزگـار و سـەرفراز دەبێـت ، وە سـەرکەوتن و بردنەوە و نەجاحەتیشی دێتەدی.

# وانـەی سێیەم و کۆتایی:

13) تەوحیـد ئەگەر بە کامـل و تەواوی لە دڵـدا دامەزرا ، وە بە کامـل و تەواویەوە بە إخـلاص و دڵسـۆزی و نـیەت پـاکیەکی تەواوەوە تەحقیقـی کـرد ئەوا بەڕاسـتی کـردەوەی کەمـیش لەلایەن ئەو بەنــدەوە ئەوا بەهــۆیەوە زۆر دەبێــت ، وە کردەوەکـانی و ووتە چـاک و باشـەکانی دوو بەرامـبەر و چەنـد بارە دەکرێت لە ڕادە بەدەر و بەبێ حساب.

14) اللـە تعـالی لە ئەسـتۆی خـۆی گرتـووە و پەیمانـی داوە بە ئەهلـی تەوحیـد بە فەتـح و سـەرکەوتن ، وە سـەرکەوتن لە دونیـادا ، وە عیـزەت و شـکۆ و ڕێـز و شـەرەف ، وە بە دەستهێنانی هیـدایەت ، وە ئاسـانکردن بـۆ ئەنجـام دانـی کـردەوەی چاکەکـان ، وە چـاکبوونی بـارو دۆخەکـان ، وە پێکـان لە ووتەکان و کردەوەکان.

15) الله عـز وجـل بەرگـری لە موەحیـدانی ئەهلـی ئـیمان دەکـات لە هەمـوو شـەڕ و خراپەیەکـی دونیـا و قیـامەت ، وە اللـە تعـالی مـنەت دەکـات بەســەر بەنـدەکانی بە گوزەرانـدنی ژیـانێکی خـۆش بۆیـان ، وە بە ئـارامی و دڵنیـایی لەکـاتی گەڕانەوەیـان بۆلای ، وە دڵخۆش بوون بە یادکردنەوەی.

العلامة السعدي رحمە اللە فەرموویەتی :

وە بەڵگەکـان لەسـەر ئەم ڕسـتانە زۆرە و زانـراوە لە قورئـان و سوننەت ـدا ، واللە أعلم.   القول السدید / ص 26 :

وە إبن تیمیة رحمە اللە فەرموویەتی :

شـادومانی و ئاسـوودەیی و خۆشـیەکی تەواو بـۆ دڵەکـان نیـیە ، تەنهـا لە خۆشەویسـتی اللـە تعـالی ــدا نەبێـت ، وە خـۆ نزیـک کـردنەوە بـۆلای ئەو بە هەمـوو ئەو کـارو کـردەوانەی کە ئەو پێـی خۆشـە ، وە خۆشەویسـتی اللـە ــش تەواو نابێـت و بەدەست ناهێنرێـت تەنهـا بە پشـتکردن نەبێـت لە هەمـوو خۆشویسـتراوێک بـێجگە لەو نەبێـت ، وە ئـا ئەمەیە حەقیقەتـی لا إلە إلا اللە.   مجموع الفتاوی 28/32 /

**16)** تەوحيد گەورەترين پاڵپشتە بۆ حەزكردن و هاندانی بەندە بۆ گوێڕايەڵی كردنی الله تعالی ، چونكە مرۆڤی موەحيد كار بۆ الله سبحانە وتعالی دەكات ، وە هەروەها كارو كردەوەی چاكە ئەنجام دەدات بە نهێنی و بە ئاشكرايی ، بەڵام كەسی غەيری موەحيد ، بۆ نموونە وەك ئەو كەسەی كە بۆ بەرچاوی خەڵك دەيكات ، كەوا خێرو صەدەقە دەكات و نوێژ دەكات ، وە يادی الله دەكات ئەگەر تەنها كەسێك لەلای بێت و بيبينێت ، وە هەر لەبەر ئەمەش هەندێك لە سەلەف دەيانفەموو : من ئاوات دەخوازم كە خۆم نزيك بكەمەوە بۆلای الله تعالی بە گوێڕايەڵی كردنی الله تعالی هيچ كەسێكيش نەيزانێت تەنها الله تعالی نەبێت.

**17)** بەڕاستی موەحيدان ئەمن ئاسايشيان بۆ هەيە و هەر ئەوانيشن هيدايەت دراون ، هەروەكو چۆن الله تعالی دەفەرموێت : ( الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ) واتە : ئەوانەی كەوا ئيمان و باوەڕيان هێناوە وە ستەم و هاوەڵگەريان تێكەڵ بە ئيمانەكەيان

نەكـردووە ، ئاسـوودەیی و هێمنـی هەر بـۆ ئەوانەیە ، هەر ئەوانەشن كەوا ڕێنمایی كراون.          سورەتی الأنعام 82 :

وە هەر لەبەر سـوودەكانی تەوحیـدە كەوا ڕێگـری مـانەوەی هەمیشـەیی دەكـات لە ئـاگردا ، ئەگەر لە دڵـی ئەو كەسـەدا بە ئەنـدازەی دەنـكە خەردەلەیەك ئیمانـی لە دڵیـدا هەبێـت ، وە ئەگەر لە دڵـی بەنـدەدا تەوحیـد كامـل و تەواو ببـوو ئەوا ڕێگـری كـوللی و هەمیشـەیی دەكـات لە چـوونی بـۆ نـاو ئـاگردا ، وە هەر لە سـوودەكانی تەوحیـد ئەوەیە كەوا بـۆ خـاوەنەی هیـدایەتی كامـل و تەواو بەدەسـت دەهێنێـت وە ئەمـن و ئاسایشـێكی تەواوی بـۆ هەیە لە دونیـا و قیـامەت ، وە هەر لە سـوودەكانی تەوحیـد ئەوەیە كەوا تەوحیـد گەورەتـرین سـەبەب و هۆكـارە بـۆ بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەنـدی اللـه تعـالی و ئەجر و پاداشـتەكەی ، وە خۆشـحاڵترینی خەڵكـیە لە شـەفاعەت كردنـی محمـد صـلی اللـه علیـه وسـلم بـۆ ئەوكەسـە ، كەوا هەركەسـێك ووتـی " : لا إله إلا الله " بە ئیخلاصی و دڵسۆزیەوە لە دڵیەوە وتبێتی.

وصلى الله على محمد وعلى آليه واصحابه اجمعين

---

سەرچاوە:

القول السديد في مقاصد التوحيد

عبد الرحمن بن سعدي :

---

